


ڕەمەزان بانگ دەکات

ئەی چاکەویست وەرە پێشەوە...



# بەچی پێشوازی لە ڕەمەزان بکەین



سەنتەری ڕۆشنبیری کارا
بەشی وەرگێڕان

سەنتەری ڕۆشنبیری کارا




ڕەمەزان بانگ دەکات...( ١ )

ئەی چاکە ویست وەرە پێشەوە ...

# بەچی پێشوازی لە ڕەمەزان بکەین؟

سەنتەری ڕۆشنبیری کارا

بەشی وەرگێڕان

# بەچی پێشوازی لە ڕەمەزان بکەین؟

سەنتەری ڕۆشنبیری کلارا
بەشی وەرگێڕان

---

ژمارەی سپاردن ( ١٥٠٤ )
تیراژ ( ٤٠٠٠ )

---

سەرپەرشتی چاپ و بڵاوکردنەوە
ماڵپەڕی بەهەشت
www.ba8.org
٠٧٧٠١٥١٧٣٧٨
هەمیشە لەگەڵمان بن بۆ بەرهەمی نوێ

# سەنتەری ڕۆشنبیری کارا

سەنتەرێکی ڕۆشنبیری و بانگەوازی ئیسلامی و گشتی هەمە لایەنە ، نا حزبی و سەربەخۆیە ، هەوڵەکانی دەخاتە گەڕ بۆ سەرخستنی بەها باڵاکان.

بۆ تێگەیاندنی ڕۆڵەکانی کوردستان و کورد زمان بە بیروباوەڕی ئیسلامی ڕەسەن بە پێی بەڵگە و تێگەیشتنی باشترین پێشینەکانی ئوممەتی ئیسلام.

دروست کردنی تاکی دڵسۆز و کارا بۆ خزمەتی ئیسلام و نیشتمان بۆ ئەوەی هۆکاری پێشکەوتنی وڵات و خەڵکی بن..

بەرنامەی پەرستن و کار و بانگەواز ، بۆ ئەوەی خەڵکی دڵسۆز بە بەرچاوڕوونی تێبکۆشن و هەنگاو هەڵنێن.

ڕێکردنەوەی تەوەری گفتوگۆ و لێك تێگەیشتن بێ کورت هەڵهاتن و توندبوون ، تەنها بەڵگە و تاوتوێ کردنی بۆچوونەکان و یەکلابوونەوەی وتەکان و بۆچوونەکان لە ڕوانگەی بەڵگەو بنچینەکانی ئیسلام .

هەنگاونان بەرە و کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی پەیوەست بە ئاینەکەیەوە ، فراوان لە کردار و گەورە لە بیرکردنەوە و جوان لە ڕەفتاردا.

ئامانجی هەموو کارەکانیشمان تەنها ڕەزامەندی خوای گەورەیە، وە پاشان خزمەت کردنی کۆمەڵگاکەمانە..

لە دوعای خێرتان بێ بەشمان مەکەن




centerkara@yahoo.com

## پێشەکی

الحمد لله وحده، والصلاة والسلام على من لا نبيّ بعده، نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين، أما بعد...

لە ڕاستیدا بۆچوون و بیرکردنەوەی خەڵك جیاوازەو هەوڵ وکۆششیان جۆراوجۆرە سەبارەت بە چۆنێتی پێشوازی کردن لە مانگی پیرۆزی ڕەمەزان و چۆنێتی بەکارهێنانی کاتە بەنرخەکانی و سەرقاڵبوونیان بەچەند کاروکردەوەیەکەوە کەئەو ڕۆژگارەی پێ بەسەردەبەن.

* بۆیە تێیاندایە بەتەمبەڵی وبێکاری وخەوتن وبێ ئاگایی لەپەرستن پێشوازی لێدەکات.

* وە تێیاندایە بە خۆ تەرخانکردن بۆ شاشەی تەلەفزیۆنەکان وسەیرکردنی زنجیرە تەلەفزیۆنەکانەوە پێشوازی لێدەکات.

* وە تێیاندایە پێشوازی لێدەکات بە بەبێداری شەوانەو، بەسەربردنی کات لە میوانداری و ڕۆیشتن بۆ بازاڕەکان و ڕیستۆرانت و هاوشێوەکانی.

* وە تێیاندایە پێشوازی لێدەکات بە زێدەڕۆیی کردن لە خواردن وخواردنەوەو دروستکردن وداهێنانی جۆری نوێی خواردن، وەك بڵێی ڕەمەزان مانگی خواردن وخواردنەوەیە نەوەك مانگی بەڕۆژوبوون !!!

* بەڵام سەرکەوتووان ئەوانەی کە خوای پەروەردگار چاکەی بۆیان ویستوە، وە چاوەکانیانی ڕۆشن کردۆتەوە بە بینینی حەق وڕاستی، و جیاکردنەوەی حەق وباتڵ، بەڕاستی ئەوانە بە خۆشحاڵی وڕووخۆشی موژدەو هۆشمەندیەوە بەرەوپیری دەچن وپێشوازی لێدەکەن، لەبەرئەوەی ئەوان ئەو هەل وفرسەتە لەو مانگەدا دەبینن کەبەهۆیەوە خوا لە تاوانەکانیان خۆشبێت وسەرپێچی وهەڵەکانیان بسڕێتەوە، چونکە ئەو مانگە مانگی لێخۆشبوون وڕەحمەت ورزگاربوونە لەئاگر.. وە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) موژدەی هاتنی ڕەمەزانی بە هاوەڵانی دەداو دەیفەرموو: " أَتَاكُمْ شَهْرُ رَمَضَانَ ، شَهْرٌ مُبَارَكٌ فَرَضَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ صِيَامَهُ ، تُفْتَحُ فِيهِ أَبْوَابُ السَّمَاءِ وَتُغْلَقُ فِيهِ أَبْوَابُ الْجَحِيمِ ، وَتُغَلُّ فِيهِ مَرَدَةُ الشَّيَاطِينِ ، لِلَّهِ فِيهِ لَيْلَةٌ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ

شَهْرٍ مَنْ حُرِمَ خَيْرَهَا فَقَدْ حُرِمَ ".(رواه النسائي وقال الألباني :صحيح لغيره)

واتە: وا مانگی ڕەمەزان بەسەرتاندا هات، کەمانگێکی پیرۆزە، خوای گەورە ڕۆژوگرتنی ئەم مانگەی لەسەرتان فەرزکردووە، دەرگاکانی ئاسمانی تێدا دەکرێتەوەو دەرگاکانی دۆزەخی تێدا دەبەسترێت، وەشەیتانەکانیشی تێدا کۆت وبەند دەکرێت، وەخوا لەم مانگەدا شەوێکی هەیە کەچاکترە لەهەزار مانگ، ئەوەی لەخێروپاداشتەکەی بێبەش بێت ئەوەبەڕاستی بێبەشە".

لێرەوە ئەو خوا پێداوانە دەزانن چی لەم مانگەدایە لەچاکەو بەخشیش وبەرهەم، بۆیە دەیانەوێت ئەو هەلانەیان لەدەست دەرنەچێت ودەستگیری بن، بۆئەوەی کەسیان پەشیمان نەبێتەوە لە ڕۆژی دواییداو بڵێت ﴿يَٰلَيۡتَنِي قَدَّمۡتُ لِحَيَاتِي﴾(الفجر: ٢٤)واتە: بەئێش وخەفەتێکەوە دەڵێت: خۆزگە من بۆئەم ژیانی پاشەڕۆژەم شتێکم پێش خستبا لەدونیادا. یان دەڵێت:﴿قَالَ رَبِّ ٱرۡجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّيٓ أَعۡمَلُ صَٰلِحٗا فِيمَا تَرَكۡتُۚ﴾(المؤمنون: ٩٩_١٠٠) .

واتە: ئەوسا دەڵێت پەروەردگارم! بمگێڕەوە بۆدونیا بەشکوئەو کارەچاکەی کاتی خۆی لەدەستم چووە بیکەم. جا ئەو کاتەش وەڵامەکە بەم شێوەیە دەبێت کەپێی دەوترێت ﴿كَلَّآ﴾ واتە نەخێر ! هەرگیز ئەوداخوازیەت بۆجێبەجێ نابێت. جا پاش ئەوە زۆر پەشیمانی دەکێشێت لەبەرئەو کەم وکورتی وتەوەزەلیەی کە هەیبووە لە هەمبەر پەرستشی خوای پەروەردگار، لەکاتێکدا ئەوپەشیمانیەی هیچ دادی نادات وسوودێکی نابێ بۆی.

لەبەر ئەمانەیە کەئەو خواپێداوانە بڕیاری یەکلاکەرەوەی خۆیان داوە بەپێشوازی کردنی مانگی پیرۆزی ڕەمەزان بەم شێوازانەی کە دێن:

## ١-تەوبە و پەشیمانی:

تەوبەکردن لەتاوان لەهەموو کاتێکدا واجبە، وەلەهەموو ساتێکدا فەریزەیەکی ئاینیە، بەڵام لە ڕەمەزاندا پێویستترە، جا ئەوەی لە ڕەمەزاندا تەوبە نەکات کەی تەوبە دەکات؟ خوای پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾(النور: ٣١) واتە: ئەی باوەڕداران هەمووتان بۆلای خوا بگەڕێنەوە وپەشیمان ببنەوە بەڵکو لەدونیاو دواڕۆژدا ڕزگارو بەختیارین.

وە هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت :

﴿قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ وَأَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُواْ لَهُۥ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿٥٤﴾ وَٱتَّبِعُوٓاْ أَحْسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴿٥٥﴾ أَن تَقُولَ نَفْسٌ يَٰحَسْرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِى جَنۢبِ ٱللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ ﴿٥٦﴾ أَوْ تَقُولَ لَوْ أَنَّ ٱللَّهَ

هَدَىٰنِي لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٥٧﴾ أَوْ تَقُولَ حِينَ تَرَى ٱلْعَذَابَ لَوْ
أَنَّ لِي كَرَّةً فَأَكُونَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٨﴾ بَلَىٰ قَدْ جَآءَتْكَ ءَايَٰتِي
فَكَذَّبْتَ بِهَا وَٱسْتَكْبَرْتَ وَكُنتَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٥٩﴾﴾ (الزمر) .

واتە: ئەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لەمنەوە بڵێ: ئەی بەندەکانی من! ئەی ئەوانەی ستەم و زیادەڕۆییتان لەخۆتان کردووە لە ڕەحمەت ومیهرەبانی خوا بێ ئومێد مەبن بەڕاستی خوا لەهەموو گوناحێ خۆش ئەبێ(دیارە ئەم بانگەشەیە بۆ تەواوی تاوانبارانە کەبگەڕێنەوە بۆلای خوا، ئەگەر چی گوناهیشیان بەئەندازەی کەفی سەرزەریاش بێت) چونکە ئەوە لێبوردەو میهرەبان * بگەڕێنەوە بۆلای خواوەندتان وملکەچی فەرمانی ئەوبن پێش ئەوە سزاکەتان بۆبێ دوایش ئیتر لەلایەن هیچ کەسێکەوە یارمەتی نادرێن * لە باشترین نامە کەپەروەردگارتان دایبەزاندووە بۆتان پەیڕەوی بکەن، واتە پەیڕەوی قورئان بکەن پێش ئەوەی کتوپڕ سزاکەتان بۆبێت هەستیش بە خۆتان نەکەن، تا شتێ بکەن بۆخۆتان * ئەوەك کەسێ بڵێ : ئەی داخ لەسەر کەمتەرخەمیم لەلای خواو لەگوێڕایەڵی خوا بێ شك لە گاڵتەکەرانیش بووم بەئاینی خواوکتێبی خوا( واتە: جگە

لەسەرپێچیم گاڵتەیشم بەموسڵمانان ئەکرد) * یان بڵێ : ئەگەر خوا ڕێنمونی بکردمایە ، لەپارێزکاران ئەبووم * یان کاتێ سزای خوا دەبینێ بڵێ: خۆزگە جارێکی تر دەگەڕامەوە بۆ دونیاو لەگەڵ چاککاران ئەبووم * خوا دەفەرمووێت: بەڵێ... خۆ گەلێ ئایەت ونیشانەکانی منت بۆ هات، جا بەدرۆت زانی وبڕوایشت نەهێنا بایی بوویت و بوویتە کافروبێباوەڕ.

**بۆیە ئەی ئەوکەسەی کەتەوبە و پەشیمانیت دوادەخەیت !**

**هەتا کەی و بۆ چ کاتێك تەوبەو پەشیمانیت دوادەخەیت ؟**

تۆ ئەو کەسە بوویت کە دەتگووت: گەر ڕۆژوو بگرم ئەوجا تەوبە دەکەم، وە ئەگەر ڕەمەزان هات ئینجا پەشیمان دەبمەوە، جا ئەوە شەوڕۆژەکانی ڕەمەزان هات و تۆش پێچەوانەی بڕیاروبەڵێنەکانت بوویتەوە.... لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا پشتت لەپەروەردگارتە، لێی ڕا دەکەیت نەوەك بۆلای ڕا دەکەیت، بەردەوامی لە سەرپێچی کردنی ودەستت هەڵنەگرتووە..... ئایا چۆن دڵنیا دەبیت کە ملك الموت (فریشتەی ڕۆح کێشان) نایەتە سەرت و تۆش لەسەر ئەم حاڵەت بیت؟ وە ئایا هیوات بەچیە لەکاتێکدا خوا یارمەتی داویت و

دەرگای تەوبەی بۆت کردۆتەوە کەچی تۆ بەرەو ئەو دەرگایە ناتەوێ بڕۆیت؟

خوای بەسۆزو میهرەبان لێخۆشبووە لەتاوانەکان، دەستی ڕادەخات بەشەو، بۆ ئەوەی لەتاوانبارانی ڕۆژ خۆشبێت، وە دەستیشی بە ڕۆژ ڕادەخات بۆئەوەی لە تاوانبارانی شەو خۆشبێت، وە بە تەوبەی تەوبەکاران وپەشیمان بوونەوەی سەرپێچیکاران خۆشحاڵ دەبێت، هەر لەبەر ئەمەیە کە خوای پەروەردگار: "بۆ تەوبەکردن دەرگایەکی لەلای ڕۆژئاواوە داناوە کە پانتاییەکەی چل ساڵە، دایناخات هەتا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵنەیەت" وەکو پێغەمبەری ڕاستگۆ فەرموویەتی. (رواه أحمد والترمذي وقال : حسن صحيح)

خوێنەری یەکخواپەرست: تەوبەکردن کارێکی سووك وئاسانە، هیچ جۆرە سەختی وبارقورسیەکی تێدانیە، بەڵکو بریتیە لە وازهێنان وپەشیمانی وبڕیاردان، وازهێنان لە تاوان وسەرپێچیەکان، پەشیمانی لەو تاوانانەی کەلە ڕابردوودا کردووتە، وبەڵێن وبڕیاردان لەوەی کە نەگەڕێیتەوە سەری لە داهاتوودا.

جا کوا تەوبەکاران بەلای پەروەردگاریان و بۆ خواسوڵحاوان ؟!

## ٢- پێشوازی لە ڕەمەزان دەکەن بەنیەت پاکیەوە بۆخوا لەهەموو کار وکردەوەیەکیاندا :

خوێنەری خۆشەویست لەسەرەتاوە پێت دەڵێم: گەر نیەتت پاك نەبێت بۆ خوا، خۆت هیلاك مەکە، چونکە کردەوە وەرناگیرێت لەبارەگای خودا هەتا بۆخوا نەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿فَمَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَـٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴿١١٠﴾﴾ (الكهف) واتە: ئینجا هەرکەسێك لە ئێوە ئومێدی بەگەیشتنی دیداری پەروەردگاری خۆی هەبێ لەدوارۆژدا با کاری چاك وکردەوەی دروست ئەنجام بدات وەلە پەرستنی پەروەردگاری خۆیدا هیچ کەسێك نەکاتە هاوتاوهاوبەشی و ڕووپامایی نەکات، چونکە خوا تەنها دڵسۆزی وئیخلاس وەردەگرێ، نە ڕییاو ڕووپامایی و هاوبەش دانان.

وە هەروەها پێغەمبەری نازدار( صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: خوا فەرموویەتی" أنا أَغْنَى الشُّرَكَاء عَنِ الشِرك، من عملَ عَمَلاً أشرك فيه معي غيري تركته وشركه"(رواه مسلم)

واتە: من بێ پێویستترین کەسم لەوانەی کە هاوبەش بڕیاردەدەن، هەرکەسێك کردەوەیەك ئەنجام بدات وجگە لەمنی تێدا بکاتە هاوبەش ئەوا خۆی وشیرکەکەی واز لێ دێنم.

وە ڕۆژوو لە گەورەترینی ئەو پەرستشانەیە کە موسڵمان ڕادەهێنێت لەسەر ئیخلاس، لەبەر ئەوەی ڕۆژووەوان کەس پێی نازانێت جگە لەخوا نەبێت، وەبەتایبەت لە جگە لە ڕەمەزان، وە تەنانەت لە ڕەمەزانیشدا ئەگەر کەسێك بەڕۆژوو نەبێت و خۆی وادەربخات کەبە ڕۆژووە ئەوا دەتوانێت، کەچی ڕێگری دەکات لەو شتانەی کە ڕۆژوو بەتاڵ دەکەنەوەو دووردەکەوێتەوە لە بچوکترین شت کەکاریگەری خراپی بۆ ڕۆژووەکەی هەبێت، لەبەر نیەت پاکیەتی ونزیك بوونەوەیەتی بۆ خواو خوازیاری ڕەزامەندی ولێخۆشبوونی خوایە، ئالێرەوەیە کە خوای کاربەجێ پاداشتی ڕۆژووی شاردۆتەوە بۆ لای خۆی، هەروەکو چۆن ڕۆژووەوان ڕۆژووەکەی دەشارێتەوە لە خەڵکی، وە ئەو خوایەی کەیەکێك لە ناووسیفەتە بەرزوپیرۆزەکانی بریتیەلە (الکریم) واتە: بەخشندە، لەپاداشت وبەخشیندا زۆرنەبێت نابەخشێت،

وەکو لە فەرموودەیەکی قودسیدا هاتووە کە خوای گەورە دەفەرمویێت: "كل عمل ابن آدم له، إلاَّ الصيام، فَإِنَّهُ لِي، وأنا أجزِي بِهِ الحسنة بعشر أمثالها، إِلى سبعمائة ضعف " واتە: هەموو کردەوەکانی مرۆڤ بۆخۆیەتی، جگە لە ڕۆژوو نەبێت کە بۆمنەو هەر خۆمیش پاداشتی دەدەمەوە، وەچاکەش پاداشتەکەی بەدە قاتە هەتا حەوت سەد قات.



## ٣- پێشوازی لە ڕەمەزان دەکەن بە شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر( صلی الله علیه وسلم ):

کردەوە وەرناگیرێت هەتاوەکو ئەم دوو مەرجەی تێدا نەبێت: ئیخلاس بۆ خواو شوێنکەوتنی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، وە ئەو ئایەتەی پێشوو ئاماژەبوو بۆ ئەم دوو مەرجە، وتەی﴿فَمَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا ﴾ ئاماژەیە بۆ شوێنکەوتنی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، وە ووتەی﴿وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا﴾ ئاماژەیە بۆ ئیخلاس ( واتە: نیەت پاکی یان تەنها خوا مەبەست بوون).

وە پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) هەموو شتێکی سەبارەت بە ڕۆژوو ڕوون کردۆتەوە، ڕوونی کردۆتەوە کەی خەڵك بە ڕۆژوو بن ولە چ کاتێکیشدا بە ڕۆژوو نەبن، پایەکان و پێویستیەکان وسوننەت وئادابەکانی ڕۆژوویشی ڕوون کردۆتەوە، وە چاکەکان وپاداشتەکانیشی ڕوون کردۆتەوە، وە هەروەها ئەو شتانەی کە ڕۆژوو دەشکێنن و ئەوانەش

کەکاریگەریان لەسەری نیە، وەهەروەها ئەو بڕوبیانوە شەرعیانەشی باس کردووە کەبەهۆیانەوە موسڵمان دەتوانێت بەڕۆژوو نەبێــت، وە باسی تریش پەیوەست بە ڕۆژوو.

بۆیە ئەرکی سەرشانی موسڵمانانە کە ئەم باسانە بزانن وکردەوەی پێبکەن بەگوێرەی سونتەتی صەحیحی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) وە وازهێنان لەوەی کە جیاوازەوپێچەوانەی سوننەت بێت، جا هەرکاتێك سوننەتێکی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ڕوون بوویەوە بۆ کەسێك دروست نیە بۆی وازی لێ بهێنێت لەبەر قسەی هەرکەسێك بێت، چونکە هەموو کەسێك قسەی وەردەگیرێت وڕەدیش دەکرێتەوە تەنها پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) نەبێت، کە فەرمایشتی لەسەر سەرچاوە.



## ٤- پێشوازی لە ڕەمەزان دەکەن بە ئارامگریەوە:

ڕەمەزان مانگی ئارامگرتنە، لەبەر ئەوەی مرۆڤ واز لە هەموو ئەو شتانە دێنێت کە خووی پێیانەوە گرتووە لە خواردن خواردنەوەو ئارەزوومەندیە بەرجەستەو مەعنەویەکان، وەکو گوێڕایەڵیەك بۆ خواو نزیك بوونەوەیەك لێی.

وە ئارامگرتن لە ناڕەحەت وسەختترینی کردەوەکانە لەسەر ناخ و دەروون، هەر بۆیەشە ئارامگرتن نیوەی ئیمانە، وە پاداشتەکەشی گەورەترین پاداشتە، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرمویت﴿إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾ ( الزمر: ١٠)

واتە: بەڕاستی ئارامگرەکان پاداشتی بێ ژمار دەدرێنەوە.

<u>وەئارامگرتن سێ جۆرە:</u>

یەکەم: ئارامگرتن لەسەر گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم).

دووەم: ئارامگرتن لەسەر نەکردنی تاوان وسەرپێچی.

سێیەم: ئارامگرتن لەسەر قەزاوقەدەر.

پێویستە لەسەر بەندە کە ئارامگرژ بکاتە هاوتای ژیانی و تێکەڵی کاروکردەوکانی بێت، چ لەسەر ئەنجامدانی چاکە وە چ لەسەر نەکردنی تاوان وە چ لەکاتی بەڵاو ناخۆشیدا، بۆیە موسڵمانی بەڕیز ئەم هۆکارانەی خوارەوە چەند خاڵێکی گرنگن کەبەهۆیانەوە بەندە دەتوانێت ئارامگری وەدەست بهێنێت:

یەکەم: خۆشەویستی خوای گەورە.

دووەم: ترس وبیم لە خوای باڵادەست.

سێیەم: شەرەفی نەفس و پاك کردنەوەی.

چوارەم: هیوا کورتی.

پێنجەم: دوورکەوتنەوە لە زیادەڕۆیی کردن لە خواردن و خواردنەوەو جل وبەرگ و جیماع و تێکەڵاوی خەڵك.

شەشەم: شەرم کردن لە خوای بیسەرو بینا.

حەوتەم: پارێزگاریکردن وڕێزگرتن لە نیعمەتەکانی خوا بەسەر بەندەوەو چاکەی خوا بەسەریەوە.

هەشتەم: هەستکردن وزانینی سووکی ونەنگی تاوان وسەرپێچی.

نۆیەم: زانینی خراپی چارەنووس وداهاتووی تاوان وخراپی شوێنەواری و ئەو زەرەروزیانانەی کەبەهۆی ئەوەوە پەیدادەبن.

دەیەم: زانینی ئەو دەرئەنجام وشوێنەوارە چاك و ئاسوودەییانەی کەبەهۆی چاکەوگوێڕایەڵیەوە بەدەست دێن.

یازدەیەم: جێگیرکردنی ڕەگی ئیمان لە دڵدا.

جا ئەم هۆکارانە ئەگەر هاتوو بەندە پێی هەستاو چاودێری لێکرد ئەوا باشترین یارمەتیدەرە بۆی لەسەر ئارامگری لە گوێڕایەڵیداو ئارامگری لە نەکردنی تاوان وخراپەدا، وەبەتایبەت لەم مانگەدا کە دۆخێکی ئیمانی وەها دێنێتەکایەوە کە وا دەخوازێت بەندە کۆشش بکات لە ئەنجامدانی کردەوەی چاکەو دووربگرێت لە سەرپێچی، وە هەروەها دووربگرێت لەو هەموو جوانکاری ورازاندنەوانەی کە ئارەزووبازان دەیکەن بۆ تاوان وئارەزووەکانیان، بۆئەوەی خێروفەڕی ئەم مانگە تێك بدەن لەخەڵکی، هەربۆیە پێویستی موسڵمان بۆ ئارامگرتن لەم مانگەدا زۆر پێویستترو گەورەترە، خواش یارمەتیدەرە.

## ٥-پێشوازی لەڕەمەزان دەکەن بەدەستگرتن بەکاتەوە وبەسەربردنی لە چاکەو گوێڕایەڵیدا :

کات بەنرخە، لەبەنرخی وگرنگی کاتەوەیە کەئەوەی لیٚ بڕوات هەرگیز ناگەڕێتەوە تا ڕۆژی دوایی، هەروەها خودی کات هۆکاری خۆشبەختی وبەدبەختی و ڕزگاربوون و تیاچوونە...

ئالێرەوەیە کە پێشینی چاکی ئەم ئوممەتە کۆششی لەڕادەبەدەریان کردووە لە پاراستنی تەمەنیان و پاراستنی کاتەکانیان و بەفیڕۆنەدانی و سووربوونیان لەسەری زیاتر لەسووربوونیان لە پارەودراو...

بۆ نموونە: سعیدی کوڕی عبدالعزیز بە عومەیری کوڕی هانئی وت دەبینم کە زمانت پشوو نادات لە زیکرویادی خوا، ئایا ڕۆژی چەندجار زیکرو تەسبیحاتی خوا دەکەیت؟ ئەویش لەوەڵامدا وتی: سەد هەزار جار !، وە ئەوە سعیدی کوڕی مسیبە کە دەڵێت: چل ساڵە نوێژێکی جەماعەتم لەدەست نەچووە ! وە پیاوێك بە عامری کوڕی عبدقیسی وت: بوەستە باقسەت لەگەڵدا بکەم، ئەویش وتی: خۆر بوەستێنە (واتە با کاتم نەڕوات)!

جارێکیان کۆمەڵێک خەڵک لای معروفی کەرخی زۆر دادەنیشن، ئەویش پێیان دەڵێت: ئایا ناتانەوێت هەستن؟ چونکە بەڕاستی فریشتەی خۆر پشوو نادات لە سوورڕدانی.



## ئەو پەرستشانەی کەلە مانگی ڕەمەزاندا دەکرێت :

{ یەکەم: بەڕۆژووبون لە ڕۆژەکەیدا: }

لەبەر ئەم ئایەتە ﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ فَلۡيَصُمۡهُۖ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٖ فَعِدَّةٞ مِّنۡ أَيَّامٍ أُخَرَۗ﴾ (البقرة: ١٨٥) واتە:ئەگەر هەرکسێکتان مانگی ڕەمەزانی بەسەرهات، وە ڕێبوارونەخۆش نەبور، بڕووبیانووی شەرعیشی نەبور، دەبێ بەڕۆژوو‌بێت، ئینجا ئەو کەسەشتان کەنەخۆشە یان لەسەفەرە ڕۆژووەکەی دەشکێنێ ودەبێ لە ڕۆژانی دیکەدا چەند ڕۆژێکی تر بەقەزا بگرێتەوە.

وە هەروەها لەبەر ئەم فەرموودەیە کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت" من صام رمضان إيماناً واحتساباً غُفِرَ لَه ماتقدم من ذنبِه"(متفق عليه) .واتە: ئەوەی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرێت باوەڕی پێ هەبێت وبەچاوەڕوانی پاداشتەوە، ئەوا خوا لەو تاوانانەی ڕابردووی خۆش دەبێت.

{دووەم: نوێژی تەراویح:}

لەبەر ئەم فەرموودەیە کە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت" من قام رمضان إيماناً واحتساباً غُفِرَ لَه ماتقدم من ذنبهِ"(متفق علیه) .

واتە: ئەوەی نوێژی تراویحی مانگی ڕەمەزان ئەنجام بدات و باوەڕی پێ هەبێت وبەچاوەڕوانی پاداشتەوە، ئەوا خوا لە تاوانی پێشووی خۆش دەبێت.

وە پێویستە موسڵمان ئەو پێشنوێژە هەڵبژێرێت و دەستنیشان بکات کە نوێژەکەی تەواوەو درێژی دەکاتەوە نابێ تەنها مەبەست وغەمی دەنگ خۆشیەکەی بێت، چونکە لەفەرموودەکەی سائبی کوڕی یزیدەوە دەڵێت: قورئان خوێن لەسەروو سەد ئایەتەوە دەیخوێند هەتا وامان لێدەهات خۆمان دەدا بەسەر گۆچانەکانمانەوە لەبەر درێژی وەستانمان، وە دەڵێت : تەوارمان نەدەکرد هەتا زۆر نزیکی فەجر دەبوویەوە.

وە سوننەت وایە نوێژخوێن نوێژەکەی لەگەڵ ئیمامدا تەواوبکات و پێش ئەو تەواوی نەکات ودەرنەچێت، لەبەر ئەم

فەرموودەیە" من قام مع إمامه حتى ينصرف، كتب له قيام ليلة"(رواه أبو داود والترمذي).

واتە: ئەوەی لەگەڵ ئیمامەکەیدا بوەستێ هەتا نوێژ تەواودەبێت ئەوا پاداشتی شەونوێژی شەوێکی بەتەواوەتی بۆ دەنوسرێت.

{سێیەم: قورئان خوێندن :}

ڕەمەزان مانگی قورئانە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت﴿ شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ هُدٗى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٖ مِّنَ ٱلۡهُدَىٰ وَٱلۡفُرۡقَانِ ﴾ (البقرة: ١٨٥) واتە: مانگی ڕەمەزان ئەو مانگەیە کە قورئانی تێدا نێردراوەتە خوارەوە، کە ڕێنمایی مەردوم دەکات بۆ گشت کارێکی چاك وچەندین بەڵگەونیشانەی زۆر ڕوونی تێدایە بۆ شارەزایی ڕێی هەق و جیاکردنەوەی ڕاست وناڕاست.

ڕە جبریل(علیه السلام) لەم مانگەدا قورئانی بە پێغەمبەر دەخوێندەوە. هەربۆیە پێشینی چاکی ئەم ئوممەتە لەم مانگەدا خۆیان تەرخان دەکرد بۆ خوێندنەوەو تێڕامانی زیاتر لە قورئان.

پێشەوا زوهری(ڕەحمەتی خوای لێبێت) کە ڕەمەزان دەهات دەیوت: بەڕاستی ئەو مانگە بریتیە لە خوێندنی قورئان و نان بەخشین.

وە عبدالرزاق دەڵێت: کە مانگی ڕەمەزان دەهات سفیانی سەوری(ڕەحمەتی خوای لێبێت) هەموو پەرستشەکانی واز لێدەهێناو ڕووی دەکردە قورئان خوێندن.

وە هەروەها زبیدی یەمانی کە مانگی ڕەمەزان دەهات، قورئانەکانی کۆدەکردەوەو هاوەڵەکانیشی بۆ کۆدەکردەوە بۆئەوەی بیخوێننەوە.

**{چوارەم: بەربانگ کردنەوە بە ڕۆژووەوان :}**

لەبەر ئەم فەرموودەیە کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت" من فطر صائماً فله مثل أجره، غير أنهُ لا ينقص من أجر الصائم الشيء"(رواه أحمد والنسائي وصححه الألباني) .

واتە: ئەوەی بەربانگ بە ڕۆژووەوانێك بکاتەوە ئەوا وەکو ڕۆژووگرەکە پاداشتی بۆ هەیە، وە جگە لەوەی کە هیچ لەپاداشتی ڕۆژووەوانەکە کەم ناکات.

{ پێنجەم: بەخشین : }

پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لە هەموو کەس بەخشندەتر بووە، وەبەتایبەت لە ڕەمەزاندا زۆر بەخشندەبووە، لەو کاتەی کە جبریل دەهاتە لای وقورئانی پێدەخوێند، وە پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لە بایەکی هەڵکردوو زیاتر خێری دەبەخشیەوە. (متفق عليه)

یەکێك لەشێوازەکانی بەخشین بریتیە لە خواردن دان بە خەڵك، ئەبو سواری عدوی دەڵێت: کۆمەڵێك لە پیاوانی هۆزی عەدی لە مزگەوت نوێژیان دەکرد، هەرگیز هیچ یەکێکیان بەتەنها بەربانگی نەدەکردەوە، ئەگەر کەسێکی دەست بکەوتایە لەگەڵیدا نانی بخواردایە ئەوا ئەمیش دەیخوارد، وە ئەگەرنا بەشە خواردنەکەی دەبردە مزگەوت و لەگەڵ خەڵکیدا دەیخوارد!

وەهەروەها عبدالله ی کوڕی ئیمامی عومەر(ڕەزای خوایان لێبێت) بەربانگی نەدەکردەوە مەگەر لەگەڵ هەتیوو هەژارەکاندا نەبوایە.

{شەشەم: عەمرەکردن لە ڕەمەزاندا : }

لەبەر ئەم فەرموودەیە کە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت" عمرة في رمضان تعدل حجة"وفي رواية "حجة معي" (متفق عليه).

واتە: عەمرەیەك لە ڕەمەزاندا بەرامبەرە بە حەجێك. لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە دەفەرموێت" بەرامبەرە بە حەجێك لەگەڵ مندا".

{حەوتەم: مانەوە لەمزگەوت بۆ خواپەرستن (الإعتكاف) : }

ئەمەش باشتر وایە لە دە ڕۆژی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندابێت، لە دایکە عائشەوە ( ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) " لە دە ڕۆژی کۆتایی ڕەمەزاندا لەمزگەوت دەمایەوە هەتا وەفاتی کرد، پاشان خێزانەکانی لە مزگەوت دەمانەوە".(متفق عليه)

**{هەشتەم: زیندووکردنەوەی شەوی قەدر : }**

لەبەر ئەم فەرموودەیە کە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت" من قام ليلة القدر إيماناً واحتساباً غفر له ما تقدم من ذنبه"(متفق عليه).

واتە: ئەوەی شەوی قەدر زیندوو بکاتەوە کە باوەڕی پێ هەبێت وبە ئومێدی پاداشتەوە ئەوا خوا لە تاوانەکانی پێشووی خۆش دەبێت.



## ٦- پێشوازی لە ڕەمەزان دەکەن بە چاك ئەنجامدانی کارو فرمان وکارزانی تێیدا :

خوای پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلًا ﴾(الكهف: ٣٠) واتە: با دڵنیابن کە ئێمە پاداشتی ئەو جۆرە کەسانە زایە ناکەین کە : کارو ڕەفتاری چاك ئەنجام دەدەن.

وە هەروەها لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت ﴿ وَٱصْبِرْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١١٥﴾ ﴾ (هود: ١١٥) واتە: ئەی پێغەمبەر لەسەر گشت قۆرت وناڕەحەتیەکان بەئارامبە، چونکە بەڕاستی خوا پاداشتی چاکەی چاکەکاران زایە ناکات.

لەبەر ئەوە ئەم خاڵە باس دەکەین چونکە خەڵکانێك – خوا هیدایەتیان بدات – ڕۆژووگرتن بە هۆکارێك دەزانن بۆ بەهەدەردانی بەرژەوەندیەکانی خەڵکی، وە کەمتەرخەمی نواندن لەسەر بەجێگەیاندنی ئەرکەکانیان، وە ئەگەریش بەرژەوەندیەك وەبیر یەکێکیان بهێنیتەوە دەڵێت: ئەوە بەس نیە کەبە ڕۆژووم؟! وەکو بڵێیت ڕۆژوو هۆکارێك بێت بۆ تەمبەڵی وپشتگوێ

خستنی بەرژەوەندی خەڵکی و بارگرانی لەسەریان، بەڵام بە پێچەوانەوە ئەم جۆرە پەرستشە هانی موسڵمان دەدات بۆ چالاکی، و تێکۆشان، و چاکەکردن بەرامبەر خەڵکی، ئاسانکاری بۆیان، هەرچەندە ئەمەش لەسەر حسابی ئاسوودەیی تاکەکەسیش بێت، لەبەرئەوەی تەماحی بەئەو خێرو پاداشتە هەیە کەلەلای خوایە.



## ٧- پێشوازی لە ڕەمەزان دەکەن بە لێبووردەیی و ڕەوشت بەرزی :

لەبەر ئەم فەرموودەیە کە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت" فَإِذا كان يوم صوم أحدكم، فلا يرفث ولا يصخب، فإن سابه أحد أو قاتله، فليقل: إِنِّي صائِم"(متفق عليه) واتە: ئەگەر یەکێکتان بەڕۆژوو بوو، با ووتەوقسەی پڕوپووچ نەڵێت وقیژەوهاوارهاوار نەکات و وەئەگەر کەسێکیش جنێوی پێدا یان شەڕی لەگەڵدا کرد با بڵێت: من بەڕۆژووم.

وە هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت" من لم يدع قول الزور والعمل به والجهل، فليس لله حاجة في أن يدع طعامه شرابه" واتە: ئەگەر ڕۆژووەوان واز نەهێنێت لە ووتەی درۆو کردەوە پێکردنی و نەفامی، ئەوا خوای بەتواناو گەورە پێویستی بەوە نیە واز لە خواردن وخواردنەوەکەی بێنێت.

بۆیە پێویستە لەسەرمان کە خۆمان بڕازێنینەوە بە ڕەوشت وبەهای ئیسلامی لەم مانگەدا وجگەلەم مانگەش، ئەو ئەرکانەی لەسەرمانە بەرامبەر پەروەردگارمان و پێغەمبەرو

موسڵمانان بەباشی ڕای بپەڕێنین، وەئەوەی پێویستە داوای
بکات بەنەرمی و لەسەرخۆیی داوای بکات، بۆ ئەوەی تەقوا
ندی بێت کە مەبەستی یەکەمی ڕۆژووە، وەکو خوای گەورە
دەفەرموێت﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن
قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾﴾ (البقرة: ١٨٣) واتە: بزانن کە ڕۆژووی
مانگی ڕەمەزانتان لەسەرنووسراوەو فەرزکراوەتەسەرتان
هەروەکو لەسەر ئەوانەی لەپێشتانەوەبوون بڕیاردراو نووسرا
بەڵکو بەتەقوا بن (سنوورەکانی خوا بپارێزن ودەرگای تاوان لە
خۆ داخەن و دەرگای هەموو خێرێ لە خۆ وازبکەن).

**{ ئەوانەی لە کاتی ڕۆژوودا پێویستە : }**

١- زیاتر پاراستنی وورگ و عەورەت لە ئارەزووبازی.

٢- پاراستنی چاوو زمان و قاچ و گوێ و ئەندامانی تر لە تاوان.

٣- بە ڕۆژووبوونی دڵ لە ئاواتی سووك و نزمخوازی، و
بەرەوبۆچوونی دوور لە خواو ڕێبازەکەی.

ئابەم شێوەیە ڕۆژوو نەوەیەکی هاوکارو خۆشەویست و
بەهێزوخۆڕاگر لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئاستەنگەکاندا پێك دێنێت.

## ٨- پێشوازی لە ڕەمەزان دەکەن بە لێپرسینەوە لەگەڵ خۆدا :

خوای گەورە دەفەرمووێت ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلْتَنظُرْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٨﴾ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمْ أَنفُسَهُمْ ﴾(الحشر: ١٨-١٩).

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! خۆپارێزبن بەجێ بەجێکردنی فەرمانەکانی و دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکان وەبا هەرکەسە سەرنج بداوبزانێ چ شتێکی بۆ سبەینێ (قیامەت) پێشخستووە لەکردەوەی چاك وەبەردەوام بن لەتەقوای خوا بەڕاستی خوا زۆر شارەزاوبەئاگایە بەکارەکانتان و هیچی لێ وون نابێت * وە ئێوە وەکو ئەو کەسانە مەبن خوایان لەبیرکردبوو گوێیان بەفەرمانەکانی نەدەدا ئینجا خواش – واسەرگەردانیکردن- خۆیان لەبیرکردوو نەیانزانی کارێکی وابکەن لەپاشەڕۆژدا سوودیان پێبدات.

وە عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێبێت) دەیووت : لێپرسینەوە لەگەڵ خۆتاندا بکەن پێش ئەوەی لێپرسینەوەتان لەگەڵدا بکرێت، وە بیپێون پێش ئەوەی بۆتان بپێورێت، چونکە

کەر ئەمڕۆ لێپرسینەوەتان لەگەڵ خۆتاندا کرد ئەوا سبەی(قیامەت) حەشروحسابتان بۆ ئاسان دەبێت.

**وە لێپرسینەوە لەگەڵ خۆدا پێش کاروکردارو پاش کرداریش دەبێت :**

- لێپرسینەوە لەپێش کردەوەکەدا بریتیە لە نیەت و شوێنکەوتنی سوننەت.

- بەڵام لێپرسینەوە دوای کردار سێ جۆرە :

یەکەم: لێپرسینەوە لەسەرئەو عیبادەتەی کەکەموکورتی تێداکراوە لە مافی خوادا:

وە مافی خواش لە عیبادەتدا شەش خاڵە:

١- نیەت پاکی لە کردەوەکەدا.

٢- ئامۆژگاری بۆ خوا.

٣- شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم).

٤- هەستکردن بە چاکەی خوا.

٥- هەستکردن بە منەتی خوا بەسەریەوە تێیدا.

٦- هەستکردن بە کەموکورتی کردن تێیدا.

دووەم: لێپرسینەوە لەگەڵ خۆیدا لەسەر هەموو کردارێك، کە وازلێهێنانی باشترە لە ئەنجامدانی.

سێیەم: لێپرسینەوە لەگەڵ خۆیدا بکات لەسەر ئەو کارە ئاسایی وخووپێوەگرتووانەی کەکردوونی، بۆچی ئەنجامی داون؟ ئایا مەبەستی پێیان خواو ڕۆژی دواییە؟ ئەوا ئەوکاتە قازانج دەکات، وەیاخود مەبەستی پێیان دونیایە؟ جا ئەوکاتەش دۆڕاودەبێت.

ئابەم شێوازانە پێشوازی لە ڕەمەزان دەکەین، لە ڕەمەزاندا دەژین، وە بە ڕەمەزان بەختەوەردەبین، وە سوود لە ڕەمەزان وەردەگرین، وەئەگەریش ئەنجامان نەدا، ئەوا ئەوەمان بەسەرد دێت کەلەم فەرموودەیەدا باسکراوە" ربَّ صائم حظه من صيامه الجوع والعطش، ورب قائم حظه من قيامه السهر" (رواه أحمد والطبراني وصححه الألباني) واتە: زۆر ڕۆژووەوان هەیە تەنها برسێتی و تێنووێتی بۆ دەمێنێتەوە، وە زۆر نوێژخوێنی شەوانیش تەنها شەونەخەوتنەکەی بۆ دەمێنێتەوە.

لە کۆتاییدا داواکارین لە پەروەردگار کەکردەوە چاکەکانمان لێ وەربگرێت، وە بەنائومێدی ودڵشکاوی نەمانگێڕێنێتەوە.

وَآخر دعوانا أن الحمدلله رب العالمين